# مَوسُوعَةُ ابنِ أَبِي الدُّنيا

## كِتَابُ الإِخْوَانُ

تأليف


أبي بكر عبد الله بن محمّد بن عبيد بن سُفيان
القرشي المعرُوف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١هـ)


وەرگێڕانی:
مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردى

# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كِتَابُ الإِخْوَانُ

تـأليف

أبي بكر عبد الله بن محمّد بن عبيد بن سُفيان
القرشي المعرُوف بابن أبي الدنيا

(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێرانی :

مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا بە كوردی

# كتاب الإخوان

**١ - قال ابن أبي الدنيا : حدثنا سعيد بن سليمان، عن إسماعيل بن زكريا، عن ليث بن أبي سليمان، عن عمرو بن مرة، عن معاوية بن سويد بن مقرن، عن البراء بن عازب .**

**وحدثنا عبد الله قال : وحدثنا إسحاق بن إسماعيل قال : حدثنا جرير، عن ليث ابن أبي سليم، عن عمرو بن مرة، عن معاوية بن سويد بن مقرن، عن البراء بن عازب قال :** كنت جالساً عند النبي ﷺ فقال : (أتدرون أي عرى الإيمان أوثق ؟) .

قلنا : الصلاة .

قال : (إن الصلاة حسن وما هي بها) فذكروا شرائع الإسلام، فلما رآهم لا يصيبون قال : (أوثق عرى الإيمان أن تحب في الله وتبغض في الله) .

١ - البراء بن عازب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : دانیشتبووم لەلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئایا ئەزانن کامە توندترین گرێی ئیمانە ؟) .

وتمان: نوێژ .

فەرمووی: (نوێژ باشە، بەڵام ئەو نیە) باسی شەڕاعیئەکانی ئیسلامیان کرد، کاتێک بینی قسەکانمان نەپێکا فەرمووی : (توندترین گرێی ئیمان ئەوەیە خۆشویستن و ڕقلێبوونت لەپێناو الله عز وجل بێت) .

٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الهيثم بن خارجة، حدثنا إسماعيل بن عياش عن صفوان بن عمرو، عن عبد الرحمن بن ميسرة، عن العرباض بن سارية، عن النبي ﷺ قال : (قال الله تبارك وتعالى : المتحابون بجلالي في ظل عرشي يوم لا ظل إلا ظلي).

٢ - له العرباض بن سارية رضي الله عنه له پێغەمبەر ەوە ﷺ كە ئەفەرمووێ : (الله تبارك وتعالى فەرموويەتی : ئەوانەی یەکیان خۆش ئەوێت لەپێناوی من لەژێر سێبەری عەرشەکەمدان لەرۆژێکدا کە هیچ سێبەرێک نیە جگە سێبەری من).

٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبد الرحمن بن صالح، حدثنا ابن فضيل، عن أبيه، عن عمارة بن القعقاع، عن أبي زرعة، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (إن من عباد الله العباداً يغبطهم الأنبياء والشهداء).

قيل : من هم ؟ لعلنا نحبهم .

قال : (هم قوم تحابوا بروح الله على غير أموال ولا أنساب وجوههم نور وهم على منابر من نور، لا يخافون إذا خاف الناس، ولا يحزنون إذا حزن الناس).

ثم تلا : ﴿ أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ [يونس : ٦٢] .

٥ - أبي هريرة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموويەتی : (لەناو بەندەکانی الله بەندەگەلێک هەن کە پێغەمبەران و شەهیدان ئاواتیان پێ ئەخوازن).

وترا : ئەوانە کێن ؟ بەڵکو خۆشمان بوێن .

فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن کە یەکتریان خۆش ئەوێت لەپێناو الله بەبێ ئەوەی پارە و سامان و خزمایەتی لە نێوانیاندا هەبێت، دەموچاویان نورە وە لەسەر مینبەرگەلێکن لە نور، ناترسن کاتێک خەڵک ترسان، خەم ناخۆن کاتێک خەڵک خەمیان خوارد و بێتاقەت بوون).

دواتر ئەمەی خوێندەوە: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [يونس: ٦٢].

٨ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا علي بن الجعد، حدثنا عبد الحميد بن بهرام، عن شهر بن حوشب، عن أبي طيبة، عن عمرو بن عبسة قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (إن الله عز وجل يقول: وجبت محبتي للذين يتحابون من أجلي، وحقت محبتي للذين يتصادقون من أجلي).

٨ - عمرو بن عبسة رضي الله عنه ئەفەرمووێ: گوێم لە رسول الله بوو ﷺ ئەیفەرموو: (الله عز وجل ئەفەرمووێ: خۆشەویستیم واجب بووە بۆ ئەوانەی لە پێناوی من یەکیان خۆش ئەوێت، وە بەڕاستی خۆشەویستیم دێتە دی بۆ ئەوانەی لەپێناوی من ئەبەخشن).

١٠ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا داود بن سليمان، حدثنا خلف بن خليفة، عن الأعرج عن عبد الله بن الحارث، عن ابن مسعود: قال رسول الله ﷺ: (المتحابون في الله على

عمود من ياقوت أحمر، في رأس العمود مائة ألف غرفة، فتضيء لأهل الجنة كما تضيء الشمس لأهل الدنيا، مكتوب في جباههم : هؤلاء المتحابون في الله ) .

١٠ - له ابن مسعود ـەوە رضي الله عنه كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەوانەی لەپێناوی الله یەکیان خۆشئەوێت لەسەر ستونێکن لە یاقوتی سوور، لە سەری ستونەکە سەد هەزار ژوور هەیە، ڕووناکی ئەبەخشن بە ئەهلی بەهەشت وەک چۆن خۆر ڕووناکی ئەبەخشێت بە ئەهلی دونیا، لە ناوچاویان نووسراوە : ئەمانە لەپێناوی الله یەکیان خۆشئەوێت ) .

١٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا ابن فضيل، عن إسماعيل بن أبي خالد، عن قرة العجلي، عن عبد الرحمن بن سابط قال : (أخبرت أن على يمين الرحمن وكلتا يديه يمين قوم على منابر من نور عليهم ثياب خضر يغشون أبصار الناظرين دونهم، ليسوا بأنبياء ولا شهداء .

قيل : من هم ؟

قال : قوم تحابوا بجلال الله حين عصي الله ) .

١٣ - عبدالرحمان بن سابط ئەڵێ : (هەواڵم پێدراوە کە لەسەر دەستی ڕاستی الرحمن کە هەردوو دەستی ڕاستە کەسانێک لەسەر مینبەری نورینن، جلی سەوزیان لەبەرە چاوی سەرنجی تەماشاکەران بۆ لای خۆیان ڕائەکێشن، ئەوانە پێغەمبەران و شەهیدان نین .

وترا : ئەوانە کێن ؟

وتی : كەسانێكن لەپێناو الله یەكتریان خۆشئەوێت لەو كاتەی سەرپێچی الله كرا).

**١٤ - قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا أبو كريب محمد بن العلاء الهمذاني، وعبد الرحمن بن صالح - واللفظ لعبد الرحمن - قال : حدثنا ابن فضيل عن أبيه قال : (لقيت أبا إسحاق بعد ما ذهب بصره، فالتزمني، فقلت : تعرفني ؟

قال : نعم، والله إني لأعرفك وإني لأحبك، ولولا الحياء لقبلتك، تدري فيمن نزلت هذه الآية ؟ حدثني أبو الأحوص، عن عبد الله قال : في المتحابين في الله : ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ **[الأنفال : ٦٣]** .

**١٤** - ابن فضيل لە باوكیەوە ئەڵێ : گەشتم بە أبا إسحاق دوای ئەوەی بینایی لەدەست دا، باوەشی پێدا كردم، وتم : ئەمناسیتەوە ؟

وتی : بەڵێ، والله من تۆ ئەناسمەوە وە من تۆم خۆش ئەوێت، لەبەر شەرم نەبووایە ماچم ئەكردیت، ئەزانیت ئەم ئایەتە دەربارەی كێ دابەزی ؟ أبو الأحوص بۆی گێڕاینەوە لە عبدالله ـەوە - واتە ابن مسعود رضي الله عنه - كە فەرموویەتی : دەربارەی ئەوانەی كە لەپێناو الله یەكتریان خۆش ئەوێت هاتووە كە : ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ **[الأنفال : ٦٣]** .

١٥ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا عبد الرحمن بن صالح، حدثنا جعفر بن بغيل، عن زهير، عن أبي إسحاق، وعن أبي الأحوص، عن عبد الله قال : (إن من الإيمان أن يحب الرجل الرجل ليس بينهما نسب قريب ولا مال أعطاه إياه، ولا محبة إلا الله ) .

١٥ - له عبدالله ـەوە - واته ابن مسعود رضي الله عنه - ئەفەرموویّت : (له ئیمانەوەیە كە كەسێک كەسێكی تری خۆش بوێت كە لەنێوانیاندا خزمایەتی نزیک نەبێت، وە ماڵ و سامانێک نەبێت كە پێی بەخشیبێت، وە خۆشەویستی نەبێت ئیللا لە پێناوی الله نەبێت ) .

١٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا عبد الرحمن، حدثنا أبو المحياة، عن منصور، عن طلق بن حبيب، عن أنس بن مالك رفعه قال : (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان، وحلاوته أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب في الله ويبغض في الله، وأن لو أوقدت نار عظيمة لو وقع فيها أحب إليه من أن يشرك بالله ) .

١٦ - أنس بن مالك رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (سێ شت هەن هەركەس تیایدا هەبێت ئەوا شیرینی ئیمان ئەچێژێت، شیرینیەكەش ئەوەیە الله و رسول ـەكەی لا خۆشەویستتر بێت لە جگە لەوان، وە خۆشویستنی لەپێناو الله بێت وە ڕقلێبوونی لەپێناو الله بێت، وە ئەگەر بێتو ئاگرێكی گەورەی بۆ بكرێتەوە و بكەوێتە ناوی لای خۆشەویستترە لەوەی شیرک بۆ الله ئەنجام بدات ) .

١٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الهيثم بن خارجة عن صدقة بن خالد القرشي، عن زجلة قالت : (كنا مع أم الدرداء جلوسا فقال لها هشام بن إسماعيل : يا أم الدرداء ما أوثق عملك في نفسك ؟

قالت : الحب في الله ) .

١٨- زجلة ئەڵێ : (لەگەڵ أم الدرداء رضي الله عنه دانیشتبووین هشام بن إسماعيل پێی وت : ئەی أم الدرداء باشترین و تۆکمەترین کردار چییە لەلات ؟

فەرمووی : خۆشەویستی لە پێناوی الله ) .

١٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا محمد بن العباس بن محمد، ومحمد بن الحسين عن داود بن المحبر، حدثنا داود بن فضالة عن ثابت البناني قال : (إنا لوقوف بجبل عرفات، فإذا شابان عليهما العباء القطواني نادى أحدهما صاحبه يا حبيب، فأجابه الآخر : لبيك أيها المحب .

قال : ترى في الذي تحاببنا فيه وتواددنا فيه يعذبنا غدا في القيامة ؟

قال : فسمعنا منادياً - سمعته الآذان ولم تره الأعين - يقول : لا ليس بفاعل ) .

١٩ - ثابت البناني ئەڵێ : (ئێمە وەستابووین لەسەر کێوی عەرەفات، دوو گەنجی لێبوو کە عەبای القطواني یان لەبەردا بوو، دانەیەکیان بانگی هاوەڵەکەی کرد: ئەی خۆشەویست .

ئەوی تریان وەڵامی داوە و وتی : لەخزمەتتدام ئەی ئەو کەسەی خۆشتئەوێت .

وتی: وای ئەبینیت ئەوەی یەکترمان خۆش ئەوێت لەپێناویدا و سۆزمان هەیە بۆ یەکتر لەپێناویدا سبەی لە قیامەتدا سزامان بدات ؟ گوێمان لە بانگەرێک - گوێیەکان گوێیان لێبوو وە چاوەکان نەیانبینی - وتی : نەخێر وا ناکات ) .

**٢٠ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا داود بن عمر بن زهير الضبي، حدثنا إسماعيل بن عياش، حدثني يحيى بن الحارث الذماري، عن القاسم، عن أبي أمامة قال : قال رسول الله ﷺ :** (ما أحب عبد عبداً إلا أكرمه الله ) .

**٢٠ -** أبي أمامة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (هیچ بەندەیەک نیە بەندەیەکی تری خۆش بوێت ئیللا الله ڕێزداری ئەکات ) .

**٢٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أبو كريب، حدثنا بن فضيل عن ليث، عن مجاهد،** عن ابن عباس رضي الله عنهما قال : (حبّ في لله وأبغض في لله، ووال في لله وعاد في لله؛ فإنها تنال ولاية الله بذلك، ولا يجد عبد طعم الإيمان وإن كثرت صلاته وصيامه حتى يكون كذلك ) .

**٢٢ -** ابن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێ : (خۆشەویستی بکە لە پێناوی الله، وە ڕقت هەبێت لە پێناوی الله، وە دۆستایەتی بکە لە پێناوی الله، وە دوژمنایەتی بکە لە پێناوی الله، چونکە دۆستایەتی الله بەوە بەدەستدێت، بەندە تامی ئیمان ناکات ئەگەر بێتو نوێژ و ڕۆژووشی زۆر بێت تا بەو شێوە نەکات ) .

٢٣ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا عبد الله بن الوضاح الكوفي، حدثنا يحيى بن يمان، عن خليد ابن دعلج، عن قتادة قال : (وجوه المتحابين من نور) .

٢٣ - قتادة ئەڵێ : (ڕووخساری ئەوانەی کە یەکترین خۆش ئەوێت - لەپێناو الله - لە نووره) .

٢٥ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا سعيد بن سليمان الواسطي، عن محمد بن طلحة بن مصرف عن مسلم بن عطية، عن الحسن قال : (قال لقمان لابنه يا بني لا تعد بعد تقوى الله من أن تتخذ صاحباً صالحاً) .

٢٥ - الحسن البصري ئەڵێ : (لقمان بە کوڕەکەی فەرموو : ئەی کوڕەکەم دوای تەقوای الله هیچ شتێک بە باشتر مەزانە لە هەبوونی هاوڕێیەکی چاک) .

٢٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا سويد بن سعيد، حدثنا بقية، عن الأحوص بن حكيم، عن أبي إسماعيل العبدي، عن أنس بن مالك قال : قال رسول الله ﷺ : (ما أحدث رجل أخاً في لله إلا بنى الله له بيتاً في الجنة) .

٢٦ - أنس بن مالك رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (پیاو هیچ هاوڕێیەک ناگرێت لەپێناوی الله ئیللا الله ماڵێکی بۆ بونیاد ئەنێت لە بەهەشتدا) .

**٢٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أحمد بن إبراهيم، حدثني أبو سلمة موسى بن إسماعيل** حدثني محمد بن الصلت قال : قال عبيد الله بن الحسن لرجل : (يا فلان استكثر من الصديق؛ فإن أيسر ما تصيب أن يبلغه موتك فيدعو لك) .

**٢٩ -** محمد بن الصلت ئەڵێت : عبیداللە بن الحسن بە پیاوێکی وت : (ئەی فڵان هاوڕێکانت زۆر بکە، لەبەر ئەوەی بچوکترینی شت کە دەستت ئەکەوێت ئەوەیە کاتێک هەواڵی مردنی تۆی پێ گەشت دووعات بۆ ئەکات).

---

**: واتە ئەگەر هیچ سودێکیشی نەبێت بۆت لەو ماوەی هاوڕێیەتییەتان خۆ کاتێک مردیت دوعای خێرت بۆ ئەکات، چ بگا بەوەی کە ئامۆژگاریت بکات بە عەقیدەی درووست و وازهێنان لە تاوان و خراپە و ئەنجامدانی کارە باشەکان و . . . دەیان شتی تر .**

**٣٠ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين قال: حدثنا داود بن مهران، حدثنا** داود بن عبد الرحمن، حدثني مزاحم بن أبي مزاحم مولى طلحة، أن رجلاً من أزد شنوءة أوصى قومه فقال : (استكثروا من الصديق؛ فإن العدو هم أكثر) .

**٣٠ -** مزاحم بن أبي مزاحم هەواڵی پێدام کە پیاوێک لە ئەهلی ئەزد وەسیەتی بۆ هۆزەکەی کرد وتی : (با هاوڕیی زۆرتان هەبێت، چونکە دوژمن زۆرترن) .

٣٢ - قال إبن أبي الدُنيا : حدثني هارون بن معروف، حدثنا سفيان، عن مسعر، عن أبي حصين قال : قال عمر بن الخطاب : (إذا رزقكم الله مودة امرئ مسلم فتشبثوا بها) .

٣٢ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (ئەگەر الله رزقی دان بە خۆشویستنی کەسێکی موسوڵمان ئەوە توووند دەستی پێوە بگرن و بیپارێزن) .

٣٤ - قال إبن أبي الدُنيا : حدثنا محمد بن إسحاق السهمي، حدثني إبراهيم بن عثمان بن زائدة، عن أبيه قال : كتب الأحنف بن قيس مع رجل إلى صديق له : أما بعد؛ فإذا قدم عليك أخ لك موافق فليكن منك مكان سمعك وبصرك؛ فإن الأخ الموافق أفضل من الولد المخالف، ألا تسمع إلى قول الله لنوح في شأن ابنه : ﴿إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ [هود : ٤٦] .

يقول : ليس من أهل ملتك، فانظر إلى هذا وأشباهه فاجعلهم كنوزك وذخائرك وأصحابك في سفرك وحضرك، فإنك إن تقربهم تقربوا منك، وإن تباعدهم يستغنوا بالله والسلام .

٣٤ - إبراهيم بن عثمان بن زائدة لە باوکیەوە ئەڵێ : الأحنف بن قيس لەگەڵ پیاوێک بۆ هاوڕێیەکی خۆی نووسی: (أما بعد، کاتێک برایەکت هاتە لات و هاوڕات بوو لە شوێنی بیستن و بینینت دای بنێ، لەبەر ئەوەی برای هاوڕا باشترە لە منداڵی پێچەوانیکار، ئایا گوێت لە فەرمایشتی الله نەبووە بۆ نوح دەربارەی کوڕەکەی : ﴿إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ [هود : ٤٦] .

ئەفەرمووێ ئەو لە ئەهلی میللەتەکەت نیە - واتە موسوڵمان نییە و کافرە - ، بەدوای ئەمە و هاوشێوەکانی بگەڕێ، وە بیانکە بە گەنیجینە و توێشووی خۆت، وە بیانکە بە هاوەڵی خۆت لە سەفەر و شوێنی مانەوەتدا، ئەگەر تۆ لێیان نزیک ببیتەوە ئەوانیش لێت نزیک ئەبنەوە، وە ئەگەر لێیان دووربکەویتەوە الله بێ نیازیان ئەکات، وە سەلام).

٣٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا محمد بن عبد الملك بن حميد المكي، حدثنا علي بن نوح حدثنا هشام بن سليمان، عن عكرمة قال : قال عمر بن الخطاب : (عليك بإخوان الصدق فكن في أكنافهم؛ فإنهم زين في الرخاء، وعدة في البلاء).

٣٥ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (دەست بگرە بە برایانی ڕاستگۆ و ببە بە سێبەریان، چونکە ئەوان جوانین لە کاتی ئاسوودەییدا، وە چەک و پێداویستین لە کاتی بەڵادا).

٣٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الحسين بن عبد الرحمن قال : حدثني إسحاق بن عمارة الحمصي قال : قال عياش بن مطرف الكلاعي: (لا حياة لمن لا إخوان له، ولا إخوان لمن لا مال له).

٣٦ - عياش بن مطرف الكلاعي ئەڵێ : (ژیان نیە بۆ کەسێک کە برای نەبێت، وە برا نیە بۆ کەسێک کە پارە و سامانی نەبێت).

٣٧ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا أبو خيثمة، وبندار بن بشار وغيرهما، عن عبد الرحمن بن مهدي قال حدثنا زهير بن محمد عن محمد بن وردان عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (والمرء على دين خليله؛ فلينظر أحدكم من يخال) .

٣٧ - أبي هريرة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەروویەتی : (پیاو لەسەر دینی هاورێکەیەتی، هەر یەکێکتان سەیری ئەوە بکەن هاورێیەتی کێ ئەکەن).

٣٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا خالد بن مرداس السراج، حدثنا أيوب بن جابر، عن أبي إسحاق، عن هبيرة بن يريم قال : قال عبد الله بن مسعود : (اعتبروا الناس بأخدانهم؛ فإن الرجل يخادن من يعجبه نحوه) .

٣٨ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (خەڵکی بە هاورێکانیان بپێون، لەبەر ئەوەی پیاو هاورێیەتی ئەوە ئەکات کە سەرسامی ئەبێت و وەک خۆیەتی).

٣٩ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني أبي وغيره، عن إسماعيل بن إبراهيم، عن أيوب، عن أبي قلابة قال : قال أبو الدرداء : (إن من فقه المرء ممشاه ومدخله ومجلسه) .

ثم قال أبو قلابة قاتل الله الشاعر : لا تسأل عن المرء وانظر قرينه) .

٣٩ - أبي قلابة ئەڵێ : أبو درداء رضي الله عنه فەرمووی : (ڕێ و ڕۆیشتن و شوێنی مانەوە و دانیشتن لە فیقهی پیاوە - واتە پیاو ئەبێت بزانێت ئەڕواتە کوێ و لەگەڵ کێ دائەنیشێت - ) .

دواتر أبو قلابة وتی: الله شاعیر بکوژێت کە ئەڵێ : (پرسیار دەربارەی پیاو مەکە بەڵکو سەیری نزیکەکەی بکە ) .

٤٠ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أحمد بن إسماعيل البتي، حدثني عبد الله بن قريش البخاري عن أبي توبة، عن عبد الله بن المبارك قال : قال الأوزاعي : (من خفيت علينا بدعته فلن تخفى علينا ألفته ) .

٤٠ - الأوزاعي ئەڵێ : (هەرکەسێک بیدعەکەیمان لێ داشارێت، ئەوە ناتوانێت لێمان بشارێتەوە کە لەگەڵ کێ تێکەڵە ) .

---

: مەبەستی ئیمام رحمه الله ئەوەیە ئەگەر کەسێک مبتدع بێت و بیدعەی هەبێت نەوێرێت دەری بخات ئەوا بە تێکەڵی کردنی ئەهلی بیدەع دەرەکەوێ بۆمان کە بیدعەچیە .

٤١ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني خالد بن خداش حدثنا عبد الله بن المبارك، عن حيوة بن شريح، عن سالم بن غيلان عن الوليد بن قيس، عن أبي سعيد الخدري - أو قال عن أبي الهيثم عن أبي سعيد - عن النبي ﷺ قال : (لا تصحب إلا مؤمناً، ولا يأكل طعامك إلا تقي ) .

٤١ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ : (هاوڕێیەتی کەس مەکە ئیللا ئیماندار نەبێت، وە با تەنها کەسێکی خاوەن تەقوا نانت بخوات).

٤٢ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني عبد الرحمن بن صالح الأزدي قال : حدثنا عبدالرحمن بن محمد المحاربي، عن مالك بن مغول، عن الحسن قال : قالوا : يا رسول الله؛ أي الأصحاب خير؟

قال : (صاحب إذا ذكرت الله تبارك وتعالى أعانك، وإذا نسيته ذكرك).

قالوا : يا رسول الله دلنا على خيارنا نتخذهم أصحاباً وجلساء؟

قال : (نعم، الذين إذا رؤوا ذكر الله).

٤٢ - الحسن ئەڵێ : وتیان : - واتە هاوەڵان رضي الله عنهم - : ئەی رسول الله کام هاوڕێیانە باشترینن؟

فەرمووی : (ئەو هاوڕێیەی کاتێک یادی الله تبارك وتعالى ت کرد یارمەتیت بدات، وە کاتێک لە بیرت چوو بەبیرت بهێنێتەوە).

وتیان : ئەی رسول الله باشترینمان پێ نیشان ئەدەیت بۆ ئەوەی بیکەین بە هاوڕێمان و هاو مەجلیسمان؟

فەرمووی: (بەڵێ، ئەوانەی کاتێک بینران الله بەبیربێتەوە).

٤٥ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا عبد الرحمن بن صالح قال: قال عثمان بن حكيم الأودي: (اصحب من هو فوقك في الدين، ودونك في الدنيا).

٤٥ - عثمان بن حكيم الأودي ئەڵێ: (هاوڕێیەتی ئەوە بکە کە لە سەرووی تۆوەیە لە دیندا، وە لە خوارووی تۆوەیە لە دونیادا).

٤٦ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا أحمد بن إبراهيم بن كثير، عن موسى بن إسماعيل، عن عامر بن أبي عامر الخزاز قال: قال لنا هاشم بن القاسم: (ما إخوان الصفا؟

فقلت أنا شيئاً، وقال هذا شيئاً.

قال: لا، ولكنه الذي يغضب لغضبك، ويرضى لرضاك).

٤٦ - عامر بن أبي عامر الخزاز ئەڵێ: هاشم بن القسام پێی وتین: (برایەتی پاک و بێگەرد کامەیە؟

من شتێکم وت کەسێکی تر شتێکی تری وت.

وتی: نەخێر، بەڵکو ئەوەی تورە ئەبێت بۆ تورە بوونت، وە ڕازی ئەبێت بۆ ڕازی بوونت).

٤٨ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني المفضل بن غسان عن أبيه قال: كان يقال: (اصحب من ينسى معروفه عندك).

٤٨ - المفضل بن غسان له باوكيەوه ئەڵێ : وتراوه هاوڕێیەتی ئەوە بکە کە لەلای تۆ چاکەکانی بیر ئەچێت ) .

: واته ئەو کەسەی چاکەکانی خۆی نادلاتەوە بە ڕووتدا و هەرگیز باسی ناکاتەوە، والله أعلم .

٥٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني المثنى بن عبد الكريم، حدثنا زافر بن سليمان، عن أبي عبد الله البصري قال : قال عبد الله بن الحسن : (أربع من سعادة المرء : أن تكون زوجته صالحة، وأن يكون ولده أبراراً، وأن تكون معيشته في بلده، وإخوانه صالحين).

٥٣ - عبدالله بن الحسن ئەڵێ : (چوار شت ئاسودەییە بۆ پیاو : خێزانەکەی صالیحە بێت، وە منداڵەکەی چاکەکار بێت، وە لە زێدی خۆیدا بژی، وە براکانی صالیح بن ) .

٥٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني إبراهيم بن موسى قال : حدثنا المعتمر بن سليمان، عن فرات بن سلمان قال : قال الحسن : (المؤمن مرآة أخيه؛ إن رأى فيه ما لا يعجبه سدده وقومه وحاطه وحفظه في السر والعلانية، إن لك من خليلك نصيبا، وإن لك نصيباً من ذكر من أحببت، فثقوا بالأصحاب والإخوان والمجالس ) .

٥٥ - الحسن البصري ئەڵێ : (ئیماندار ئاوێنەی براکەیەتی، ئەگەر شتێکی تێدا بینی کە حەزی پێ نەئەکرد ئەوا یارمەتی ئەدات و دایئەپۆشێت و دەوری ئەدات و

ئەپیارێزێت لە نهێنی و ئاشکرادا، لە دۆستەکەتدا بەشێک هەیە بۆ تۆ، وە بەشێک هەیە بۆ تۆ لەو کەسەی خۆشت ئەوێت، بە توندی دەست بگرن بە هاوڕێیان و برایان و مەجلیسەکانەوە).

**٥٦ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثني عبد الرحمن بن صالح، حدثني الحكم بن يعلى، عن القاسم بن الفضل الحداني، عن معاوية بن قرة قال:** (نظرنا في المودة والإخاء فلم نجد أثبت مودة من ذي أصل).

**٥٦ -** معاوية بن قرة ئەڵێ: (تەماشای خۆشەویستی و برایەتیمان کرد هیچ خۆشەویستیەکمان نەبینیەوە جێگیرتربێت لە خۆشەویستەک کە خاوەنی ڕەگ و بناغەیە).

**٥٩ - قال إبن أبي الدّنيا: و به قال محمد حدثنا عبيد الله بن محمد قال حدثنا أصحابنا** قال كانت الحكماء تقول: (إن مما يجب للأخ على أخيه مودته بقلبه، وتزيينه بلسانه، ورفده بماله، وتقويمه بأدبه، وحسن الذب والمدافعة عنه في غيبته).

**٥٩ -** عبيدالله بن محمد ئەڵێ: هاوەڵانمان بۆیان گێڕاینەوە کە حەکیمەکان وتوویانە: (ئەوەی واجبە لەسەر برا بۆ براکەی ئەوەیە لە دڵەوە خۆشی بوێت، وە جوانی بکات بە زمانی، وە یارمەتی بدات بە پارەکەی، وە ڕێزی لێ بگرێت بە ئەدەبەکەی، وە بەرگری لێ بکات لە کاتی ئامادەنەبوونیدا).

٦٣ - قال إبن أبي الدُنيا : حدثني الحسين بن عبد الرحمن عن بعض رجاله قال : قال ابن عباس : (أحب إخواني إلي الذي إذا أتيته قبلني، وإذا غبت عنه عذرني).

٦٣ - ابن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (خۆشەویستترینی براکانم لام ئەوەیانە کە چوومە لای پێشوازیم لێ ئەکات، وە کاتێک دیار نەبووم لای پۆزشم بۆ دێنێتەوە).

٦٥ - قال إبن أبي الدُنيا : حدثنا عبيد الله بن عمر الجشمي قال : حدثني يحيى بن سعيد قال : وحدثنا محمد بن الفرج، ويحيى بن يزيد الأهوازي، عن ثور بن يزيد، عن حبيب بن عبيد عن المقدام بن معدي كرب قال : قال رسول الله ﷺ : (إذا أحب أحدكم أخاه فليخبره أنه يحبه).

٦٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر براکەی خۆش ئەوێت با هەواڵی پێ بدات کە خۆشی ئەوێت).

٦٩ - قال إبن أبي الدُنيا : حدثنا عبد الله بن الهيثم، عن يحيى بن أبي بكير، عن الحسن بن صالح، عن زبيد، عن مجاهد قال : حدثت أن النبي ﷺ قال : (إذا أحب أحدكم أخاه في الله فليعلمه؛ فإنه أبقى في الألفة، وأثبت في المودة).

٦٩ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ : (ئەگەر یەکێک لە ئێوە براکەی خۆش ئەوێت لەپێناوی الله با ئاگاداری بکاتەوە، چونکە ئەوە هۆگری زیاتر ئەکات، وە سۆز و خۆشەویستی جێگیرتر ئەکات) .

٧٠ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا أحمد بن جميل، أخبرنا عبد الله بن المبارك، عن حماد بن سلمة، عن ثابت، عن سبعة بن حبيب الضبع أن رجلاً أتى النبي ﷺ فقال بعض أصحابه : إني لأحبه في الله .

فقال النبي ﷺ : (وهل أعلمته ؟)

قال: لا .

قال : (فقم فأعلمه) .

فقام إليه فقال : يا فلان، إني أحبك في الله .

قال : أحبك الذي أحببتني فيه .

٧٠ - لە سبعة بن حبيب الضبع ـەوە رضي الله عنه ئەفەرمووێ : پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، یەکێک لە هاوڕێیەکانی وتی : من ئەوم خۆش ئەوێت لە پێناوی الله .

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (ئایا ئاگادارت کردووەتەوە ؟) .

وتی: نەخێر .

فەرمووی : (هەڵسە ئاگاداری بکەرەوە) .

هەستایەوە و وتی : ئەی فلان من تۆم خۆش ئەوێت لە پێناوی الله .

وتی : ئەو کەسە خۆشی بوێت کە لە پێناویدا منت خۆش ئەوێ .

٧٢ - قال إبن أبي الدّنيا : زياد بن أيوب قال : حدثنا عبد الحميد أبو عبد الرحمن قال : حدثنا أبو كعب الشامي، مكحول قال : قال رسول الله ﷺ : (من كان في قلبه مودة لأخيه، ثم لم يطلعه عليه فقد خانه ) .

٧٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (هەر کەس لە دڵیدا خۆشەویستی هەبێت بۆ براکەی، دواتر دەری نەخات بۆی ئەوا خیانەتی لێ کردووە ) .

٧٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أبو أحمد حدثنا داود بن المحبر، عن الضحاك بن يسار الخزاعي، عن يزيد بن عبد الله بن الشخير قال : (إني كنت معه فلقيه رجل فقال : إني حدثت أن الرجل إذا لقي أخاه فقال : إني أحبك في الله كتب لهما تحت العرش وإني أحبك في الله عز وجل ) .

٧٣ - یزید بن عبدالله بن الشخیر ئەڵێ : (من لەگەڵیدا بووم [مەبەستی باوکیەتی رحمه الله، والله أعلم] گەشتە پیاوێک، وتی: من پێم گەشتووە کە پیاو کاتێک گەشتە براکەی بڵێت خۆشم ئەوێت لەپێناوی الله بۆیان ئەنوسرێت لە ژێر عەرشدا وە منیش تۆم خۆش ئەوێت لەپێناوی الله عز وجل ) .

٧٥ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا محمد بن قدامة الجوهري، حدثنا أبو بكر بن عياش عن أبي يحيى الفتات، عن مجاهد قال : مر على عبد الله بن عباس رجل فقال : إن هذا يحبني .

فقيل : أني علمت ذلك ؟

قال : إني أحبه .

٧٥ - مجاهد ئەڵێ : پیاوێک دای بە لای عبداللە بن عباس دا وتی : ئەوە منی خۆش دەوێت .

وترا : لەکوێوە ئەمەت زانی ؟

وتی : منیش خۆشم ئەوێت .

٧٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا يحيى بن قطن الأيلي، حدثنا عبد الله بن صالح - كاتب الليث - قال : حدثنا الليث بن سعد، عن يحيى بن سعيد عن عمرة، عن عائشة عن النبي ﷺ قال : (الأرواح جنود مجندة؛ فما تعارف منها ائتلف، وما تناكر منها اختلف) .

٧٨ - لە عائشة ەوە رضي اللە عنها لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرمووێ : (ڕۆحەکان سەربازانێکی جۆراوجۆرن، ئەوانەی یەکتر ئەناسن هۆگری یەکتر ئەبن، ئەوانەی یەکتر ناناسن جیاواز ئەبن) .

٨٠ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني عبد الرحمن بن صالح، حدثني الحكم بن يعلى، عن القاسم بن الفضل، عن أبي جعفر قال : (اعرف المودة في قلب أخيك لما له في قلبك) .

٨٠ - أبي جعفر ئەڵێ : (سۆز و خۆشەویستی بناسەوە لە دڵی براکەتدا بەوەی لە دڵی خۆتدا هەیە) .

---

**:واتە وەک کورد ئەڵێت دڵ ئاوێنەی دڵە، خۆشەویستی براکەت بۆ تۆ هێندەی خۆشەویستی تۆیە بۆ براکەت،تەماشای ئەثەری ٧٥ بکە، والله أعلم .**

٨١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني الحسين بن عبد الرحمن، عن منصور بن سفيان قال : قيل لأبي حازم ما القرابة ؟

قال : المودة .

قيل : فما اللذة ؟

قال : الموافقة .

قيل : ما الراحة ؟

قال : الجنة .

٨١ - منصور بن سفيان ئەڵێ : بە أبي حازم وترا : نزیکی چیە ؟

وتی : خۆشەویستی .

وترا : چێژ چیه ؟

وتی : هاوڕایی و هاودەنگی .

وترا : ئاسوودەیی چیه ؟

وتی : بەهەشت .

**٨٣ - قال ابن أبي الدنيا : حدثنا محمد بن عبد الله الأدرمي، حدثنا المعتمر بن سليمان عن عمارة بن المعول، عن الحسن قال :** (كان عمر بن الخطاب الله يذكر الرجل من إخوانه في بعض الليل فيقول : يا طولها من ليلة، فإذا صلى المكتوبة غدا إليه، فإذا التقيا عانقه) .

**٨٣ -** الحسن ئەڵێ : (عمر بن الخطاب رضي الله عنه بیری یەکێک لە براکانی ئەکرد لە هەنێک شەودا و ئەیفەرموو: ئەی شەو چەند درێژی، کاتێک نوێژی فەرزی بکردایە بەیانیەکەی ئەچوو بۆ لای، کاتێک پێی بگەشتایە لە باوەشی ئەگرت) .

---

**: ڕەنگە زۆربەمان وا تێگەشتبین ئیمامی عمر رضي الله عنه کەسێکی ڕەق و توڕە بووبێت کەچی سەیری ئەو دڵە نەرمە سبحان الله .**

**٨٤ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني علي بن الجعد، حدثنا سفيان - يعني الثوري - عن** شعبة قال : خرج عبد الله بن مسعود على أصحابه فقال: (أنتم جلاء حزني) .

**٨٤ -** شعبة ئەڵێ : عبدالله بن مسعود چووە لای براكانی و فەرموون : (ئێوە لابەرەكانی خەمی منن) .

**٨٥ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا عبيد الله بن عمر بن ميسرة، حدثنا الوليد بن مسلم،** عن الأوزاعي قال : سمعت بلال بن سعد يقول : (أخ لك كلما لقيك ذكرك بحظك من الله خير لك من أخ كلما لقيك وضع في كفك دينارا) .

**٨٥ -** بلال بن سعد ئەڵێ : (برایەكت هەبێت كە هەموو جارێک پێی گەشتی بەشی خۆت یادی الله ـت بیربخاتەوە باشترە بۆت لە برایەک كە هەموو جارێک پێت بگات و دینارێک لە ناولەپت دابنێ) .

---

**: ئەگەر ئەڵێی فەقیرم لە ڕووی پارە و سامانەوە خۆ ڕەنگە دەیان برای وات هەبێت كە بیانبینی الله ـت بیربكەوێتەوە، ئایا ئێستا تێگەشتی هیچ كەس وەک تۆ دەوڵەمەند نیە ؟!**

٨٧ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن عباد، حدثنا سفيان، عن مالك بن مغول قال: قال لي طلحة بن مصرف: (للقياك أحب إلي من العسل).

٨٧ - مالك بن مغول ئەڵێ: طلحة بن مصرف پێی وتم: (بینینی تۆ لەلام خۆشترە لە هەنگوین).

٨٨ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا خالد بن خداش و خلف بن هشام قالا: حدثنا حماد بن زيد عن خالد بن مسلمة قال: لما جاء نعي زيد بن حارثة أتى رسول الله ﷺ منزل زيد فخرجت عليه ابنة لزيد، فلما رأت النبي ﷺ أجهشت في وجهه، فبكى النبي ﷺ حتى انتحب، فقيل: يا رسول الله ما هذا؟

قال: (هذا شوق الحبيب إلى حبيبه).

٨٨ - خالد بن مسلمة ئەڵێ: کاتێک هەواڵی مردنی زيد بن حارثة گەشت رسول الله ﷺ چوو بۆ ماڵی زيد کچەکەی زيد هاتە دەرەوە، کاتێک پێغەمبەری بینی ﷺ دڵی پڕ بوو، پێغەمبەر ﷺ گریا هەتا وای لێهات دەنگی ئەبیسترا، وترا: ئەی رسول الله ئەمە چیە؟

فەرمووی: (ئەمە تامەزرۆیی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی).

---

: اللهم بمانگەیەنیت بە لیقای رسول الله ﷺ تا دەست و قاچە موبارەکەکانی ماچ بکەین و بیگرینە باوەش.

٩٦ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا عبد الأعلى بن حماد قال : حدثنا حماد بن سلمة، عن ثابت عن أبي رافع، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (إن رجلاً زار أخا له في قرية، فأرصد الله على مدرجته ملكاً فقال : أين تريد؟

قال : أريد أزور أخاً لي في هذه القرية .

قال : له هل له عليك نعمة تربها؟

قال : لا، إني أحببته في الله عز وجل .

قال : فإني رسول الله إليك، إن الله أحبك كما أحببته) .

٩٦ - له أبي هريرة ەوە رضي الله عنه ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووى : (پیاوێک سەردانی براکەی کرد لە لادێیەک، الله فریشتەیەکی دانا لەسەر ڕێگاکەی، فەرمووی : بەنیازی کوێیت؟

وتی : بەنیازم سەردانی براکەم بکەم لەم لادێیە .

فەرمووی : ئایا چاکەیەکی هەیە بەسەرتەوە؟

وتی : نا، من خۆشم ئەوێت لەپێناوی الله عز وجل .

فەرمووی : من نێردراوی الله م بۆ لای تۆ، الله تۆی خۆش ئەوێت وەک چۆن تۆ براکەت خۆش ئەوێت) .

٩٨ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا علي بن الجعد قال: أخبرنا عبد الحميد بن بهرام، عن شهر ابن حوشب، عن أبي طيبة، عن عمرو بن عبسة قال: سمعت النبي ﷺ يقول: (قال الله عز وجل: حقت محبتي للذين يتزاورون من أجلي).

٩٨ - عمرو بن عبسة رضي الله عنه ئەفەرمووێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ ئەیفەرموو: (الله عز وجل ئەفەرمووێ: خۆشەویستیم واجب بوو بۆ ئەوانەی سەردانی یەکتر ئەکەن لەپێناوی من).

١٠٥ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا شجاع بن الأشرس بن ميمون بن خشرم بن نباتة عن الكلبي - يعني أبا جناب -، عن عطاء قال: انطلقت أنا وابن عمر وعبيد بن عمير إلى عائشة، فدخلنا عليها، وبيننا وبينها حجاب، فقالت يا عبد الله ما يمنعك أن تزورنا؟

فقال: قول الشاعر: زر غباً تزدد حباً).

١٠٥ - عطاء ئەڵێ: من و ابن عمر و عبيد بن عمير ڕۆشتین بۆ لای عائشة، چووینە ژوورەوە بۆ لای، لە نێوان ئێمە و ئەودا پەردەیەک هەبوو، فەرمووی: ئەی عبدالله چی ڕێگریت لێ ئەکات لەوەی سەردانمان بکەیت؟

فەرمووی: وتەی شاعیر: کەم کەم سەردان بکە، خۆشەویستی زیاد ئەبێت).

١١٠ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا نصر بن علي الجهضمي، حدثنا عمرو بن حمزة، حدثنا المنذر بن ثعلبة، عن أبي العلاء بن الشخير، عن البراء قال : لقيت رسول الله ﷺ فصافحني، فقلت : يا رسول الله ، كنت أحسب أن هذا من زي العجم .

قال : (نحن أحق بالمصافحة منهم، ما من مسلمين التقيا فتصافحا إلا تساقطت ذنوبها بينهما ) .

١١٠ - البراء رضي الله عنه ئەفەرمووێ : گەشتم بە رسول الله ﷺ تەوقەی لەگەڵدا کردم، وتم : ئەی رسول الله، من وام حساب ئەکرد ئەمە لە ڕەفتاری عەجەم بێت .

فەرمووی : (ئێمە شایستەترین لەوان بە تەوقە کردن، هیچ دوو موسڵمانێک نیە کە بگەن بە یەکتر و تەوقە بکەن ئیللا تاوانەکانیان ئەوەرێت لە نێوان دەستیاندا ) .

١١١ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا أحمد بن محمد بن أيوب، حدثنا أبو بكر بن عياش عن أبي إسحاق، عن أبي داود قال : دخلت على البراء بن عازب فأخذت بيده، فقال : سمعت النبي ﷺ يقول : (ما من مسلم يلقى أخاه، فيصافح أحدهما صاحبه إلا غفر لهما قبل أن يتفرقا ) .

١١١ - أبي داود ئەڵێ : چوومە لای البراء بن عازب دەستی گرتم، فەرمووی : گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ ئەیفەرموو : (هیچ موسڵمانێک نیە بگات بە براکەی یەکێکیان تەوقە بکات لەگەڵ هاوەڵەکەیدا ئیللا لێیان ئەبوردرێت پێش ئەوەی جیا ببنەوە ) .

١١٣ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا عبد الله بن الهيثم حدثنا يزيد بن هارون عن حماد بن سلمة، عن أبي الحسين المديني، عن أيوب بن بشير، عن رجل من عنزة، أنه قال: سألت أبا ذر هل كان رسول الله ﷺ يصافحكما إذا لقيتموه؟

فقال: ما لقيت رسول الله ﷺ إلا صافحني

١١٣ - پیاوێک له عنزة ئەڵێ: پرسیارم کرد له أبا ذر ئایا رسول الله ﷺ تەوقەی لەگەڵدا ئەکردن کاتێک پێتان بگەشتایە؟

فەرمووی: نەگەشتووم بە رسول الله ﷺ ئیللا تەوقەی لەگەڵدا کردووم).

١١٤ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا عبد الله بن الهيثم، حدثنا أبو معاوية، عن ليث، عن مجاهد، عن معاذ قال: (إذا التقى المسلمان فضحك كل واحد منهما في وجه صاحبه ثم أخذ بيده تحاتت ذنوبهما كما يتحات ورق الشجر).

١١٤ - معاذ رضي الله عنه ئەفەرمووێ: (ئەگەر دوو موسڵمان بگەن بە یەکتر و هەر یەکێکیان پێبکەنێت بە ڕووی هاوەڵەکەیدا، دواتر دەستی بگرێت، تاوانەکانیان ئەوەرێت وەک چۆن گەڵای دار ئەوەرێت).

١١٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إسحاق بن إبراهيم، حدثنا بن المبارك، عن يحيى بن أيوب، عن عبيد الله بن زحر عن علي بن زيد عن القاسم، عن أبي أمامة الله قال : (من تمام تحياتكم المصافحة) .

١١٧ - أبي أمامة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (له تەواویێتی سەلامکردنتان تەوقە کردنە) .

١١٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الفضل بن إسحاق، حدثنا أبو قتيبة، عن شعبة، عن غالب اليمان عن الشعبي قال : (كان أصحاب النبي ﷺ إذا التقوا تصافحوا) .

١١٨ - الشعبي ئەڵێ : (هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بگەشتنایە بە یەکتر تەوقەیان ئەکرد) .

١٢٠ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إسحاق قال: حدثنا فضيل بن عياض، عن هشام، عن الحسن قال : (المصافحة تزيد في المودة) .

١٢٠ - الحسن البصري ئەڵێ : (تەوقەکردن خۆشەویستی زیاد ئەکات) .

**١٢١ - قال ابن أبي الدنيا : حدثنا محمد بن صالح، عن أبي عبيدة الحداد، عن جسر عن الحسن قال : (كلما غمزت به صاحبك أشد تحاتت الذنوب) .**

**١٢١** - الحسن البصري ئەڵێ : (هەرکاتێک دەستی هاوەڵەکەت بە توندی گرت، تاوانەکان ئەوەرێن) .

**١٢٣ - قال ابن أبي الدنيا : حدثنا داود بن زهير الضبي، حدثنا محمد بن عبد الله بن عبيد بن عمير، عن يحيى بن سعيد عن القاسم، عن عائشة قالت :** (لما قدم جعفر وأصحابه تلقاه رسول الله ﷺ واعتنقه)

**١٢٣** - عائشة رضي الله عنها ئەفەرمووێ : (کاتێک جعفر و هاوڕێیانی هاتنەوە - **له حەبەشە** - رسول الله ﷺ بەرەوپیری چوو و لەباوەشی گرت) .

**١٢٤ - قال ابن أبي الدنيا : حدثنا إسحاق بن إبراهيم، عن بشر بن المفضل، عن خالد بن ذكوان قال : حدثني أيوب بن بشير، عن فلان العنزي قال : أخبرني أبو ذر قال :** (أرسل إلي رسول الله ﷺ في مرضه الذي توفي فيه، فأتيته فوجدته نائماً، فأكببت عليه فرفع يده فالتزمني) .

**١٢٤** - أبو ذر ئەفەرمووێ : (رسول الله ﷺ ناردی بەدوامدا لەو نەخۆشیەی کە تیایدا وەفاتی کرد، چوومە لای بینیم خەوتووە، دەستم هێنا بەسەریا، دەستی بەرزکردەوە و لەباوەشی گرتم) .

١٢٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني فضل بن إسحاق، عن أبي قتيبة، عن شعبة، عن غالب التمار، عن الشعبي قال : (كان أصحاب رسول الله ﷺ إذا قدموا من سفر تعانقوا).

١٢٦ - الشعبي ئەڵێ : (هاوەڵانی رسول الله ﷺ کاتێک بگەڕانایەتەوە لە سەفەر یەکتریان لە باوەش ئەگرت) .

١٢٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا خلف بن هشام، حدثنا أبو عوانة ، عن أبي بلج قال : (رأيت الأسود بن يزيد وعمرو بن ميمون التقيا فاعتنقا ) .

١٢٨ - أبي بلج ئەڵێ : (الأسود بن يزيد و عمرو بن ميمون م بينی گەشتن بە یەک و باوەشیان کرد بە یەکتردا) .

١٢٩ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني الفضل بن إسحاق، عن أبي قتيبة، عن سفيان الثوري عن زياد بن فياض، عن تميم بن سلمة : (أن عمر رضي الله عنه لما أتى الشام استقبله أبو عبيدة ابن الجراح وفاض إليه ألماً، فالتزمه عمر وقبل يده وجعلا يبكيان).

١٢٩ - تميم بن سلمة ئەڵێ : (عمر رضي الله عنه گەشتە شام و أبو عبيدة ابن الجراح پێشوازی لێکرد و ئازاری هەبوو، عمر ی لە باوەش گرت و دەستی ماچ کرد و بەیەکەوە گریان) .

١٣٠ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني عبد الله بن الهيثم قال: حدثني يزيد بن هارون، عن حماد بن سلمة، عن أبي الحسين المدني، عن أيوب بن بشير، عن أبي ذر قال: (أرسل إلي رسول الله ﷺ، فأتيته وهو على سريره، فلما رآني اعتنقني).

١٣٠ - أبي ذر رضي الله عنه ئەفەرمووێ: (رسول الله ﷺ ناردی بەدوامدا، چوومە لای ئەو لەسەر جێگاکەی بوو، کاتێک بینیمی لەباوەشی گرتم).

١٣١ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا محمد بن عباد المكي قال: حدثنا سفيان، عن بن أبي خالد، عن قيس، عن جرير قال: (ما رآني ﷺ منذ أسلمت إلا تبسم في وجهي).

١٣١ - جرير رضي الله عنه ئەفەرمووێ: (پێغەمبەر ﷺ سەیری نەکردووم لەو کاتەوەی موسڵمان بووم ئیللا زەردەخەنەی کردووە بە ڕووومدا).

١٣٢ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا محمد بن الحسين، حدثني عبد الوهاب بن عطاء قال: أخبرني سعيد بن أبي عروبة، عن عبيد الله بن رزيق عن الحسن قال: (من الصدقة أن تلقى أخاك ووجهك إليه منطلق).

١٣٢ - الحسن البصري ئەڵێ: (لە صەدەقە و چاکە ئەوەیە بگەیت بە براکەت و دەموچاوت گەش بێت).

١٣٣ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا علي بن الجعد، حدثنا سلام بن مسكين، عن عقيل بن طلحة - وكان أبوه قد شهد المشاهد كلها مع النبي ﷺ - عن جري - أو أبو جري الهجيمي - قال : قلنا : يا رسول الله، إنا من أهل البادية ؛ فنحب أن تعلمنا عملا لعل الله أن ينفعنا به .

قال : (لا تحقرن من المعروف شيئاً، ولو أن تفرغ من دلوك في إناء المستسقي، وأن تكلم أخاك ووجهك إليه منبسط ) .

١٣٣ - أبو جري ئەفەرمووێ : وتمان ئەی رسول الله، ئێمە ئەهلی لادێکانین، حەزەکەین کارێکمان فێر بکەیت بەڵکو بەهۆیەوە الله سوودمان پێ بگەیەنێت .

فەرمووی : (هیچ چاکەیەک بە کەم مەزانن، ئەگەرچی ئاوتێکردن بێت لە دەفرەکەی خۆتەوە بۆ پەرداخی کەسێک کە ئاوی پێ ئەدەیت، وە قسەکردن لەگەڵ براکەتدا و ڕووتخۆش بێت ) .

١٣٥ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني أبي، عن موسى بن داود، عن عامر بن يساف، عن يحيى بن أبي كثير قال : كان رجل يكثر الضحك، فذكر عند النبي ﷺ فقال : (أما إنه سيدخل الجنة وهو يضحك ) .

١٣٥ - يحيى بن أبي كثير ئەڵێ: پیاوێک زۆر پێئەکەنی، لای پێغەمبەر ﷺ باس کرا، فەرمووی : (ئەچێتە بەهەشتەوە بە پێکەنینەوە ) .

**١٣٦ - قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني ابن الأعرابي النحوي قال: (لقي يحيى بن زكريا عيسى بن مريم عليهما السلام ويحيى متبسم متهلل الوجه، وعيسى قاطب متعبس، فقال عيسى ليحيى: أتضحك كأنك آمن ؟!

فقال يحيى لعيسى: كأنك آيس ؟!

فأوحى الله عز وجل: إن ما فعل يحيى أحب إلينا).

١٣٦ - ابن الأعرابي ئەڵێ: (يحيى بن زكريا گەشتە عيسى بن مريم عليهما السلام وە يحيى زەردەخەنەی ئەكرد و دەموچاوی گەش بوو، وە عيسى دەموچاوی گرژ بوو، عيسى بە يحيى ی فەرموو: پێئەكەنیت وەک ئەوەی ئەمین بیت ؟!

يحيى بە عيسى ی فەرموو: وەک ئەوەی بێ ئومێد بیت ؟!

الله عز وجل وەحی كرد: ئەوەی يحيى كردی خۆشەویستترە لامان).

**١٣٧ - قال إبن أبي الدّنيا**: **حدثنا يعقوب بن إسماعيل بن حماد الأزدي قال: حدثنا أبو أحمد الزبيري قال: حدثنا شريك، عن يزيد بن زياد، عن عكرمة قال**: كان النبي ﷺ إذا لقي الرجل فرأى في وجهه البشر صافحه).

١٣٧ - عكرمة ئەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ كاتێک بگەشتایە بە پیاوێک كە ڕووخۆشی بە دەموچاویەوە ببینیایە تەوقەی لەگەڵدا ئەكرد).

١٣٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا أحمد بن أبي بكر مولى بني هاشم، حدثني عمر أبو جعفر قال : كان يقال : (أول المودة طلاقة الوجه، والثانية التودد، والثالث قضاء حوائج الناس ) .

١٣٨ - عمر أبو جعفر ئەڵێ : (ئەوترا سەرەتای خۆشەویستی گەشی دەموچاوە، وە دووەم میهرەبانی و دڵسۆزیە، وە سێیەم جێبەجێکردنی پێداویستی خەڵکە ) .

١٣٩ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا إبراهيم بن عبد الله بن حاتم قال : حدثنا أبو معاوية، عن أبي إسحاق الخميسي، عن يونس، عن الحسن قال : (التودد إلى الناس نصف العقل ) .

١٣٩ - الحسن البصري ئەڵێ : (میهرەبانی و دڵسۆزی لەگەڵ خەڵک نیوەی ژیریە ).

١٤٠ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا الوليد بن سفيان العطاري البصري - وكان ثقة - قال: حدثنا عبيد بن عمرو الحنفي قال : حدثنا علي بن يزيد عن سعيد بن المسيب، عن أبي هريرة قال رسول الله ﷺ : (رأس العقل بعد الإيمان بالله التودد إلى الناس ) .

١٤٠ - لە أبي هريرة ـەوە رضي الله عنه كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (لوتكەی عەقڵ دوای ئیمان هێنان بە الله بریتیە لە دڵسۆزی و میهرەبانیە لەگەڵ خەڵكی ) .

١٤٢ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثنا داود بن عمرو، حدثنا محمد بن عبد الله بن عبيد بن عمير، عن يحيى بن سعيد، عن القاسم بن محمد، عن عائشة قالت : (لما قدم جعفر وأصحابه تلقاه رسول الله ﷺ فقبل بين عينيه ) .

١٤٢ - عائشة ئەفەرمووێ : (کاتێک جعفر و هاوەڵەکانی گەڕانەوە - له حەبەشه - رسول الله ﷺ بەرەوڕووی ڕۆیشت و ناوچاوانی ماچ کرد ) .

١٤٣ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثنا علي بن الجعد قال : أخبرني عبد الملك بن حسين، عن زياد بن فياض، عن تميم بن سلمة : (أن عمر بن الخطاب لما قدم الشام استقبله أبو عبيدة ، فنزل فقبل يده ) .

١٤٣ - تميم بن سلمة ئەڵێ : (کاتێک عمر بن الخطاب گەشته شام أبو عبيدة پێشوازی لێکرد، دابەزی دەستی ماچ کرد ) .

١٤٤ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني الفضل بن إسحاق، عن أبي قتيبة، عن مالك بن مغول، عن طلحة بن مصرف قال : (دخلت على خيثمة ، فقبل يدي وقبلت يده ) .

١٤٤ - طلحة بن مصرف ئەڵێ : (چوومه لای خيثمة ، دەستی ماچ کردم و دەستیم ماچ کرد).

**١٤٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا فضل، عن أبي قتيبة، عن حماد بن سلمة، عن** عاصم بن بهدلة قال : (قدمت من سفر، فدخل علي أبو وائل فقبل يدي) .

**١٤٥ -** عاصم بن بهدلة ئەڵێ : (گەڕامەوە لە سەفەر، أبو وائل هاتە لام و دەستی ماچ کردم) .

**١٤٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني سويد بن سعيد قال : حدثنا سفيان، عن علي بن** زيد قال : قال ثابت لأنس بن مالك : مست يد رسول الله ؟

قال: نعم .

قال: فناولني يدک .

فناوله يده فقبلها .

**١٤٦ -** ثابت بە أنس بن مالك ی وت: دەستت بەر دەستی رسول الله ﷺ کەوتووە ؟

فەرمووی : بەڵێ .

وتی: دەستم بدەرێ .

جا دەستی دایە و ماچی کرد.

**١٤٧ - قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني سويد قال : (رأيت سفيان بن عيينة يقبل يد فضيل بن عياض) .

**١٤٧ -** سويد ئەڵێ : (سفيان بن عيينة م بينى دەستى فضيل بن عياض ى ماچ ئەكرد) .

**١٥١ - قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا أبو الحسن الشيباني قال : حدثنا بقية بن الوليد، حدثني أبو خالد الفلسطيني، عن عطاء الخراساني : (أن أصحاب رسول الله ﷺ كانوا يقبلون يده) .

**١٥١ -** عطاء الخراساني ئەڵێ : (هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەستيان ماچ ئەكرد) .

**١٥٢ - قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا أحمد بن عبد الأعلى، حدثنا هشيم قال : أخبرنا بعض القرشيين،** عن حاطب : (أن أعرابيا أتى النبي ﷺ فاستأذنه في تقبيل رأسه، فأذن له، ثم استأذنه في تقبيل يده فأذن له، ثم استأذنه في تقبيل رجله فأذن له) .

**١٥٢ -** حاطب ئەفەرمووێ : (دەشتەكيەک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای لێكرد رێی پێ بدات سەری ماچ بكات رێی پێدا، دواتر داوای لێكرد رێی پێ بدات دەستی ماچ بكات رێی پێدا، دواتر داوای لێكرد رێی پێ بدات قاچی ماچ بكات رێی پێدا) .

١٥٣ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا أبو طالب عبد الجبار بن عاصم، حدثنا عبيد الله بن عمر، عن بصيرة، عن الحسن، عن أبي رجاء العطاردي قال : قدمت المدينة فرأيت عمر رضي الله عنه يقبل رأس أبي بكر رضي الله عنه ) .

١٥٣ - أبي رجاء العطاردي ئەڵێ : (گەشتمە مەدینە بینیم عمر رضي الله عنه سەری أبو بكر ماچ ئەکات رضي الله عنه ) .

١٥٤ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا الحسين بن محمد، حدثنا المعتمر بن سليمان، عن إياس بن دغفل قال : (رأيت أبا نضرة قبل خد الحسن ) .

١٥٤ - إياس بن دغفل ئەڵێ : (بینیم أبا نضرة ڕوومەتی الحسن ی ماچ کرد ) .

١٥٥ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا علي بن الجعد قال : أخبرنا عبد الحميد بن بهرام، عن شهر بن حوشب، عن أبي طيبة، عن عمرو بن عبسة قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (إن الله عز وجل يقول : حقت محبتي للذين يتبادلون من أجلي ) .

١٥٥ - عمرو بن عبسة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : گوێم له رسول الله بوو ﷺ ئەیفەرموو : (الله عز وجل ئەفەرمووێت : خۆشەویستیم واجب بوو بۆ ئەوانەی له پێناوی من ئەبەخشن ) .

**١٥٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا أبو معاوية، عن الأعمش عن نافع، عن ابن عمر قال :** (رأيتنا وما أحد بأحق بديناره ودرهمه من أخيه المسلم) .

**١٥٧** - ابن عمر رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (بینیمان هیچ کەس زیاتر لە براکەی شایستەی دینار و درهەمەکەی نیە) .

**١٥٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا محمد بن الحسين قال : حدثنا سعيد بن سليمان، عن إسحاق بن كثير، عن عبد الله بن الوليد قال :** قال لنا أبو جعفر محمد بن علي : يدخل أحدكم يده في كم صاحبه، ويأخذ ما يريد ؟

قلنا : لا .

قال : فلستم بإخوان كما تزعمون .

**١٥٩** - عبدالله بن الوليد ئەڵێ : (أبو جعفر محمد بن علي پێی وتین : یەکێک لە ئێوە دەست ئەکەن بە باخەڵی هاوڕێکەتان و ئەوە دەربهێنن کە ئەتانەوێ ؟

وتمان : نا .

وتی : ئێوە برا نین وەک ئەوەی بانگەشەی ئەکەن .

---

**: مەبەستی ئیمام رحمه الله ئەوەیە هەرکات بە بێ پرس پارە یان هەر شتێک ویستت دەرت هێنا لە باخەڵی براکەتدا ئەمجا پێی ئەوترێ برایەتی ڕاستەقینە .**

١٦٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين قال : حدثنا محمد بن عبد العزيز حدثني واقد الصفار قال : (شكوت يوماً إلى أسد الحاجة، فأدخل يده في صنفة فأخرج خمسين درهماً فدفعها إلي ) .

١٦٣ - واقد الصفار ئەڵێ : (ڕۆژێکیان شەکوای پێویستیەکی خۆم بردە لای أسد، دەستی کرد بە باخەڵیدا و پەنجا درهەمی پێدام ) .

١٦٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن عبد المجيد قال : حدثنا المعافى بن عمران قال : قال عمر بن ذر يوما في مجلسه : (اللهم اكفنا ضيق المعاش ) .

قال : (فجمع له أربعة آلاف درهم ) .

١٦٥ - المعافي بن عمران ئەڵێ: ڕۆژێکیان عمر بن ذر لە مەجلیسەکەیدا وتی : (اللهم تەسکی و تەنگی ژیانمان بۆ فراوان بکەیت .

جا چوار هەزار درهەمی بۆ کۆکرایەوە ) .

١٧٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثت عن عبد الله بن المبارك، عن عبيد الله بن الوليد عن أبي جعفر، أن النبي ﷺ قال : (لأن أعطي أخاك في الله درهماً أحب إلي من أن أتصدق بعشرة، ولأن أعطي أخاك في الله عشرة أحب إلي من أن أتصدق على مسكين بمائة ) .

١٧٥ - له أبي جعفر ـهوه له پێغهمبهرهوه ﷺ كه فهرموویهتی : (ئهگهر درههمێک ببهخشم به براکهم لهپێناوی الله لام خۆشهویستتره لهوهی ده درههم ببهخشم، وه ئهگهر ده درههم ببهخشم به براکهم لهپێناوی الله لام خۆشهویستتره لهوهی سهد درههم ببهخشم به ههژاران).

١٩٦ - قال إبن أبي الدّنيا: أخبرني محمد بن الحسين، حدثنا عبد الله بن يزيد المقرئ، حدثنا سعيد بن أبي أيوب، حدثني عبد الله بن الوليد، عن أبي سليمان الليثي، عن أبي سعيد الخدري عن النبي ﷺ قال: (أطعموا طعامكم الأتقياء، وأولوا معروفكم المؤمنين).

١٩٦ - له أبي سعيد الخدري ـهوه له پێغهمبهرهوه ﷺ كه فهرموویهتی : (خواردنهکانتان بدهن خاوهن تهخواکان، وه له چاکهکردنهکانتاندا ئیمانداران پێشبخهن).

٢٠١ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا حفص بن عمر المقري، حدثنا إسماعيل بن عياش عن طلحة بن عمرو، عن عطاء، عن عبد الله بن عمر قال: (أحب الطعام إلى الله عز وجل ما كثرت عليه الأيدي).

٢٠١ - عبدالله بن عمر رضي الله عنه ئهفهرمووێ : (خۆشهویستترین خواردن لای الله عز وجل ئهوهیه که دهستهکان لهسهری زۆر بن).

: واته قه‌ره‌باڵغ بێت .

٢٠٥ - قال إبن أبي الدّنيا : أخبرني محمد بن الحسين، حدثني أبو عمر الضرير، حدثنا فضالة الشحام قال : كان الحسن إذا دخل عليه إخوانه أتاهم بما عنده، وربما قال لبعضهم : (أخرج السلة من تحت السرير) فيخرجها، فإذا فيها رطب فيقول: (إنما ادخرته لكم) .

٢٠٥ - فضالة الشحام ئه‌ڵێ : الحسن كاتێک براكانی بچوونایه‌ته لای، له‌وه‌ی له‌لای بووایه پێی ئه‌دان، به هه‌ندێكیانی ئه‌وت : (ئه‌و زه‌مبیله ده‌ربێنه له‌ژێر ئه‌و جێگایه)، ده‌ریان ئه‌هێنا، كاتێک خورمای ته‌ڕی تیابووایه ئه‌یوت: (ئه‌مه‌م بۆ ئێوه داناوه) .

٢٠٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد، أخبرنا الفضل بن دكين، حدثنا أبو خلدة قال : دخلنا على ابن سيرين أنا وعبد الله بن عون، فرحب بنا وقال : (ما أدري كيف أتحفكم ؟! كل رجل منكم في بيته خبز ولحم، ولكن سأطعمكم شيئاً لا أراه في بيوتكم) فجاء بشهدة، وكان يقطع بالسكين ويطعمنا .

٢٠٦ - أبو خلدة ئه‌ڵێ : من و عبدالله بن عون چووینه لای ابن سيرين، به‌خێرهاتنی كردین و وتی : (نازانم چیتان پێشكه‌ش بكه‌م ؟! هه‌موو پیاوێک له ئێوه له ماڵه‌كه‌یدا نان و گۆشت هه‌یه، به‌ڵكو خواردنێكتان پێ ئه‌ده‌م نه‌تانبینیبێت له ماڵه‌كانتاندا) جا شانه‌یه‌ک هه‌نگوینی هێنا، به چه‌قۆ ئه‌یبڕی و ئه‌یدا پێمان بیخۆین.

٢٠٨ - **قال ابن أبي الدنيا**: حدثني أبو جعفر الصيرفي، عن أبي إسحاق الأقرع قال: رأيت عبد الله بن المبارك يخرج من عند سفيان بن عيينة مسروراً طيب النفس، فقيل له في ذلك، فقال: (وما يمنعني من ذلك؛ حدثني ابن عيينة بأربعين حديثاً، وأطعمني خبيصاً).

٢٠٨ - أبي إسحاق الأقرع ئەڵێ: عبداللە بن المبارك م بینی دەرئەچوو لە ماڵی سفیان بن عیینة بە دڵخۆشییەوە، دەربارەی ئەمە پێم وت، وتی: (چی ڕێگریم لێ ئەکات لەوە، ابن عیینة چل فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، وە حەڵوایەکی پێدام بیخۆم).

٢٠٩ - **قال ابن أبي الدنيا**: وحدثت عن شعيب بن حرب قال: (كان حمزة الزيات يقرئنا القرآن، ويطعمنا الخبيص).

٢٠٩ - شعيب بن حرب ئەڵێ: (حمزة الزيات قورئانی فێر ئەکردین، وە حەڵوای پێئەداین).

٢١٠ - **قال ابن أبي الدنيا**: حدثنا سويد بن سعيد، حدثني عيسى بن يونس، عن الأعمش قال: كان خيثمة يصنع الخبيص والطعام الطيب، فيدعو إبراهيم معه ويقول: (كلوا، ما أشتهيه، ما أصنعه إلا لكم).

٢١٠ - الأعمش ئەڵێ : خيثمة حەڵوای درووست ئەکرد لەگەڵ خواردنێکی خۆشدا، إبراهيم ی بانگ ئەکرد و ئێمەشی بانگ ئەکرد لەگەڵیدا، ئەیوت : (بیخۆن، من حەزم لێی نیە، تەنها بۆ ئێوەم درووست کردووە) .

٢١٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني إبراهيم بن سعيد قال : حدثنا يونس بن محمد، حدثنا عبيد الله بن النضر، عن عون بن يونس قال : دخل رجل على الحسن، فوجده نائماً على سريره، ووجد عند رأسه سلة فيها فاكهة، ففتحها فجعل يأكل منها، فانتبه فرأى الرجل يأكل، فقال : (رحمك الله، هذا والله فعل الأخيار) .

٢١٤ - عون بن يونس ئەڵێ : (چوومە لای الحسن بينيم خەوتووە لەسەر جێگاکەی، بينيم لای سەری زەمبيلەيەکی لێيە کە ميوەی تيايە، کرديەوە بۆ ئەوەی لێی بخوات، خەبەری بووەوە بينی پياوێک ئەيخوات، وتی : ڕەحمەتی الله ت لێ بێ، والله ئەمە کرداری باشترينەکانە) .

٢١٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني بن عبد الرحمن، عن أحمد بن أبي الحواري قال : قال أبو سليمان الداراني : (لو أن الدنيا كلها لي في لقمة، ثم جاءني أخ لأحببت أن أضعها في فيه) .

٢١٧ - أبو سليمان الداراني ئەڵێ: (ئەگەر دوونيا هەمووی بۆ من لە پارووەيەکدا بێت، دواتر برايەکم بێت حەزەکەم بيکەم بە دەميەوە) .

٢٢٠ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا أبو حفص الصفار قال: حدثنا محمد بن سواء، عن هشام ابن حسان، عن أبي الجارود، عن عطية العوفي، عن أبي سعيد الخدري الله قال: قال رسول الله ﷺ: (من كسا مؤمناً على عري كساه الله من إستبرق الجنة).

٢٢٠ - له أبي سعيد الخدري ەوە رضي الله عنه ئەفەرمووێ: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەس براکەی پۆشتە بکات لە ڕووتی، الله پۆشتەی ئەکات لە پۆشاکی بەهەشت).

٢٢١ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا علي بن الجعد، أخبرنا أبو معاوية، عن أبي حيان التيمي قال: رئي على علي بن أبي طالب ثوب كأنه يكثر لبسه، فقيل له فيه، فقال: (هذا كسانيه خليلي وصفيي عمر بن الخطاب، إن عمر ناصح الله فنصحه الله).

٢٢١ - أبي حيان التيمي ئەڵێ: علي بن أبي طالب بینیرا بە جلێکەوە کە زۆر لەبەری ئەکرد، پرسیاری لێکرا دەربارەی، فەرمووی: (ئەمە پۆشاکی خۆشەویستەکەم و برا دڵسۆزەکەم عمر بن الخطاب ە، عمر بۆ الله دڵسۆز بوو، الله ش لەگەڵی وا بوو).

٢٢٢ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا إبراهيم بن سعيد، عن أبي معاوية، عن أبي عمر الشمالي قال: (قدم الأشعث بن قيس من مكة، فلما صلى الفجر أمرهم فأخذوا بأبواب المسجد، فأمر لكل من في بحلة ونعلين.

**٢٢٢** - أبي عمر الثمالي ئەڵێ : (الأشعث بن قيس هاتە مەككە، كاتێک نوێژی بەیانی کرد فەرمانی کرد لای دەرگاکانی مزگەوت بگرن، بۆ هەر یەکێک لەوانەی لە مزگەوت بوون جلێکی جوان و باش و جووتێک نەعلی پێدان) .

**٢٢٦** - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا عبد الله، عن علي بن عبد الله، عن سفيان قال : (رأى مجمع التيمي على سفيان الثوري إزاراً متخرقاً، فجاء بأربعة دراهم، فقال : اشتر بها إزاراً) .

**٢٢٦** - سفیان ئەڵێ : (مجمع التيمي جلێكی سوتاوی لەبەر سفيان الثوري دا بینی، چوار درهەمی هێنا و وتی : جلێكی پێ بکڕە) .

https://t.me/ibnuabydunya

الله تعالى وامان لێبكات وەكو سەلەف رحمهم الله مامەڵە بكەین لەگەڵ هەموو برا و خوشكێكی ئەهلی سوننەماندا، آمين أجمعين